لەرێی خودا دەبەخشرێت و نافرۆشرێت

# ژیانی گەورەی شەهیدان

## (ئیمامی حەمزە)



ئامادەکردنی
عوسمان تۆفیق بانیشاری

# ســـانی گەورەی شەهیدان

## «ئیمامی حەمزە»

ئامادەکردنـــــی

عوسمان تۆفیق بانیشاری

٢٠١٠

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ژیانی گەورەی شەهیدان﴿ئیمامی حەمزە﴾

ئامادەکردنی: عوسمان تۆفیق بانیشاری

تایپ و هەڵەدۆز: ڕیاز محمودکاکە

پێداچونەوە: عومەر محمد زەڵمی

دیزاینی بەرگ وناوەوە: شەهرام عبدالله

چاپخانە : سیڤا ـ شەقامی مەولەوی .

ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی (١٢٢٤) ی ساڵی (٢٠١٠) ی وەرگرتووە .

# پێشکەشـــــە

* بەگیانی پاکی پێغەمبەری خوا (ﷺ)(محمد المصطفى).

* بەگیانی پاکی هاوەڵان و تابیعین.

* بەدایك و باوکی خۆشەویستم.

* بە خوشك و براکانم.

* بەو گەنجە خوێن گەرمانەی کاردەکەن بـۆ بـەرەو پـێش بردن و سەرخستنی ئیسلام.

## پێشەکـــــــی

**الحمد لله والصلاة والسلام علی محمد وعلی آلـه وأصـحابه وأتباعه الی یوم الدین..**

**خوشکان و برایانی ئیماندار، سەلامی خوای میهرەبانتان لیٚ بێت، ئازیزان شارەزا بوون له ژیانی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵه بەرێزەکانی، یەکێکه لەو پێویستییانەی ئەوەی که موسـڵمانه دەبێت بەپێی تواناله ژیانیان شارەزابێت، هـەتا ئـەو سـوودو وانانەی لەژیانیاندا فێری ببێت، بۆیه منیش حەزم کرد، وەك موسـڵمانێك بچـمه خزمـەتی ژیـانی ئیمـامی حـەمزه تـا موسڵمانان ( إن شاالله ) شارەزا بن، له جیهادی و هـەوڵی و چاونەترسی و ماندوو بوونی ئەم کەڵه پیـاوە، وە شـارەزا بن لێی، چـونکه هـاوەڵان کەسـانێکن خـوای میهرەبـان**

تەوبەی لێ وەرگرتوون،ولێیـان ڕازی بـووە و دەفـەرمووێت:
﴿لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ﴾ التوبة ١١٧.
واتە: بێگومان خوا تەوبەی وەرگـرت لـە پێغەمبـەرو (ﷺ) کۆچـــــــــــەرو دانیشـــــــــــتووان).
﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّـهُ﴾البینـة٨.
واتە:خوای گەورە لەوان ڕازی بووە وئەوانیش لەخوای گەورە ڕازی بوون،ئائەوەش لەبـەر ئـەو مـل کەچـی وترسـانەیان بووبۆخـوای گەورەوپـەروەردیگار.وە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە وەسفیاندا دەفەرمووێت: (أصـحابی کنجـوم بـأیهم إقتـدیتم إهتدیتم). واتە: هاوەڵانی من وەك ئەستێرەن، هەر کامیـان بکەی بە پێشەنگ ڕێگە ون ناکەیت.!

خوێنەرانی بەڕێز ئەمە وەسفی هاوەڵانە، بەڕاستی زۆرحەیفە،لەژیانیان شارەزا نەبین. هەر کەم و کوڕییەکم هەیە لە خۆمەوەیە، وە هەر چاکەو باشییەکی تیایە لە فەزلی خوای میهرەبانەوەیە، داواتان لێ دەکەم لەدوعای خێر بێ بەشم نەکەن، خوای گەورە لێم قبووڵ بکات وەو پاداشتی خێرمان بداتەوە. آمین

ئامادەکار ( ٢٠١٠/٧/١٠ خورماڵ)

# ناو و ڕەچەڵەکی

ئیمامی حەمزە ناوی (حەمزەی کوڕی عبدالمطلبی کوڕی هاشمی کوڕی عبدالمنافە) نازناو کونیەکەی (أبو عمارە)یە، مامی پێغەمبەر خوایە (ﷺ)، هەروەها برای شیریشیەتی، چونکە جاریەی ئەبوو لەهەب شیـــری داوە بە هەردووکیان، هەشت برای هەبوو تەنها ئیمامی عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) موسڵمان بووە، شەش خوشکی هەبووە (صەفیەو عاتیکەو ئوروا) موسڵمان بوون (خوایان لێ ڕازی بێت).

## ژیانی پێش موسڵمان بوونی

ئیمامی حەمزە پێش ئەوەی موسڵمان ببێـت، پـێش ئـەوەی ئـایینی حـەق و ڕاسـتی، بـۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بنێردرێت،کارو پیشەی ڕاوکردن بـووە، و یـەکێك بـووە لـە ئـازاترین و بەجـەرگ تـرین پیـاوانی قـورەیش، کـە لـەو سەردەمەدا هەر کەس ئازاو شمشێر زان و تیــرزان بووایـە، ئەوا ڕێزی تایبەتی خۆی هـەبووە، ئیمـامی حـەمزە یـەکێك بووە لەو کەسانەی، کە لەناو قورەیشدا ڕێزی تایبەتی خـۆی هەبووە، وە ژیانی منداڵی زۆربەی کاتەکانی ژیانی لەگـەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر بردووە، چونکە لە تەمەنێکـدا بوون. وهەرکات ئیمامی حەمزە،دەچوو بەلای پیشەو کـاری خۆیەوە کە ڕاوکردن بوو، لە بیاباندا بیــری لـە ئاسمـان و

زەوی دەکردەوە. بەم شێوەیە ئیمامی حەمزە ژیانی بەسەر دەبرد، وە خەڵکی تریش هەندێکیان دەسەڵاتدارو هەندێکی تر کوێلایەتی، و بەندەی دەسەڵاتداران بوون، وە بەکاریان دەهێنان تا ژیانی خۆیانی پێ بەسەر بەرن، وە هەندێکی تر، بە ئاشکرا کردنی کاری فاحشەو داوێن پیسی، وە لەلایەکی تریشەوە یەکێکی ترلەو دەردانە، زیندە بەچاڵ کردنی ئافرەتان بوو. کاتێك یەکێکیان دەیزانی خێزانەکەی کچی بووە، ڕووی نەدەهات بچێتە ناو کۆمەڵگە، چونکە خۆی زۆر بە شەرمەزار دەزانی، یان دەبوایە زیندە بەچاڵی بکردایە، وەکو قورئانی پیرۆز باسی ئەکات و ئەفەرمووێت:

﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨) يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ النحل ٥٨ – ٥٩.

واتە: هەرکاتێ یەکێ لەوانە مزگێنی کچی پێ بدرێ، رووی رەش دائەگەڕێ و بۆ خۆی پیش دەخواتەوە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی – بە بۆچوونی خۆی - لەبەر ئەو مژدە خراپەی پێی دراوە، ئایا بیهێڵێتەوە بەسەر شۆڕی (بەخێوی بکات) یان زیندە بەچاڵی بکات، بێدار بن ئای چەند خراپە ئەو بڕیارە دەیدەن. ژیان بەم شێوەیە لە مەککەدا دەگوزەرا، تا خوای گەورە (جل جلاله) پێغەمبەری خوای (ﷺ) نارد، تا عەدالەت و ڕێزگرتنی ئافرەتان بگێڕێتەوە، وە کۆیلایەتیش نەهێڵێت.

# موسڵمان بوونی ئیمامی حەمزە

ئاینی پیـــرۆزی ئیسلام، تاکە ئاینێکـە تـا ڕۆژی قیامـەت بەردەوامە،و نەسخ نابێتەوە هەر کـەس بـاوەڕی بـە ئیسـلام نەبێت، ئەوە بەڕاستی لەڕۆژی پەسلاَندا لە خەسارەت مەندان دەبێت، وەکو خوای میهرەبان لەقورئانی پیـــرۆزدا تۆماری کردووە،و دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾آل عیمران ٨٥.

واتە: هەرکەسێك، بێجگە لە بەرنامەو شەریعەتی ئیسلام، هەر دینێك بۆ خۆی هەڵبژێرێ و بیکاتە بەرنامەی خۆی، هـەرگیز لێی وەرناگیـــرێ، وە لە دوارۆژیشدا لەریزی زیانمەندانـە).!

بۆیە ئیسلام کەسانێکی باش و بەجەرگ و ئـازای دەوێ، تـا هەموو تەمەنی لە خزمەتی ئیسلامدا بباتە سەر، بۆیە ئیمـامی

حەمزە (خوا لێی ڕازی بێت)، یەکێك بوو لەو کەڵە پیاوانەی ئازاو بەجەرگ و خزمەت کاری دین بوو، تا خوای گەورە (جل جلاله) ئەم ڕێزو گەورەییەی پێ بەخشی، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتانەی بۆ دابەزی، کە خزمە نزیکەکانی بانگ بکات و دەفەرمووێت: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ (٢١٤) وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ شوعەرا ٢١٤ - ٢١٥.

واتە: سەرەتا عەشرەت و خێڵە نزیکەکەت بە سزای خوا بترسێنە، باڵی میهرەبانی و سۆزت نەوی بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی کە پەیڕەویت لێ ئەکەن. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خزم و کەسە نزیکەکانی کۆکردەوە دەعوەتێکی بۆ کردن و فەرمووی:

(یا فاطمه بنته محمد یا صفیة بنته عبدالمطلب یا بنی عبد المطلب لا أملك لكم من الله شیئاً سلوني من مالی شئتم). واتە: ئەی فاتمەی کچی موحەممەد، ئەی صەفیەی کچی عەبدول موتەلیب، بە تەما نەبن بەبۆنەی خزمایەتیەمەوە، خوا لێتان خۆش ببێت، ئەگەر ئیمان نەهێنن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەواخزمایەتی هیچتان بۆ ناکات، لە ماڵ و سامان هەر چیان پێ خۆشە با داوای بکەن. لەم دەعوەتەدا ئیمامی حەمزە وەڵامی داواکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی نەدایەوە،و سەری داخست و هیچی نەوت، تا ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی،جارێك ئیمامی حەمزە وەك ڕۆژانی پێشووی، لە ڕاوکردن بەرەوماڵەوە دەگەڕایەوە، هەر کات بگەڕایەتەوە سەرەتا دەچوو بۆ کەعبە، تا تەوافێك بکات بە دەوری کەعبەدا، کەنیزەکێکی

ئازادکراوی (عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان) هات بۆ لای و پێی وت ئەی (أبو عمارە) خۆزگە بە چاوەوە دەبوویت تۆزێك لەمەوبەر (ئەبوو جەهل) چ قسانێکی ناشیرینی بە موحەممەدی برازات دەوت، بۆیە ئیمامی حەمزە زۆر تووڕە بوو، ڕۆیشت بەدوای ئەبو جەهلدا لەوێ نەمابوو، بەڵام بەر لەوەی بکاتە کەعبە سەیری کرد، ئەبوو جەهل لەناو کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی قورەیشدا دانیشتووە بۆیە بە هێمنییەکی ترسناکەوە لە ئەبوو جەهل نزیك بوویەوە، کەوانەکەی بەرز کردەوە، کێشای بەسەر فیرعەونی ئەو سەردەمەدا، کە ئەبوو جەهل بوو، زۆ ربەتوندی سەری بریندار کرد، وتی: لەکاتێکدا من لەسەر دینی ئەوم و ئازاری ئەدەیت کێش دەیەوێت با تۆڵەم لێ بکاتەوە، بۆیە کۆمەڵێك وتیان: حەمزە هەڵگەڕایەوە، لە ترسی شێری

ئیسلام هیچیان پێ نەکرا، ئیمامی حەمزە (خـوای لێ ڕازی بێت)، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، شەیتان وەسوەسەی بۆ درووسـت کرد، چـۆن کەسـێکی ئـازاو گـەورە واز لـە دینـی بـاو و باپیـــرانت دەهێنیت. بۆیە ئیمامی حەمزە، ئەوەشـــی لـەیاد بوو، کە لە تەمـەنی منداڵییـەوە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) گەورە بووە، کە هیچ شتێکی خراپـی لێ نـەبینیوە،و جوانترین خوو ڕەوشتی هەیە. کە گومـانی هـەبێت لـەوەی شوێنی بکەوێت یان نەکەوێت.

بۆیە زۆر گرنگە ئێمەی موسڵمان بەتایەتی گەنجان، بـزانین هاوڕێمان کێیە، تا بتوانین خوای میهرەبـان لـەخۆمان ڕازی بکەین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرمووێت: (المـرء علـى دين خليله،فلينظر أحدكم من يخالل). رواه الترمذي.

واتـــــە: مـــــرۆڤ لەســــەر ئــــایین و بیـــــــروباوەڕی خۆشەویستەکەیەتی، دەبا هەریەك لـە ئێـوە سـەیر بکـات، بزانێ کێی خۆش دەوێت، و هاوەڵێتی کـێ دەکـات. جـا گەنجی خۆشەویست بزانە کێ هاوڕێتە، ئەگەر کەسـێکە ڕوو لە مزگەوتە،و دیندارە ئەوە زۆر چاکە، بەڵام ئەگەر کەسـێکە دوور لە مزگەوت و دوور لە دینە هەوڵبدە بانگی بکەیت بـۆ ڕێگای ڕاست، ئەگـەر نـەهات ئـەوە خـۆتی زۆر لێ نزیـك مەکەرەوە، چونکە تـۆش وەکـو خـۆی لێ دەکـات. بۆیـە ئیمامی حەمزە (خوای لێ ڕازی بێـت)، پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) باش دەناسی، ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت، پاشان داوای لە خوای گەورە کرد، تا ڕێـی ڕاسـتی و سـەرفرازی پیشان بدات، وە بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەگەر ئەم دینـە تازەشـــی چـــاك نیـــە لێـــی لابـــدات، پاشـــان وتـــی:

(اللهم إن كات هذا رشدا فاجعل تصديقه في قلبي و إلا فاجعل لي مما وقعتا فيه مخرجا). بۆ بەیانی چوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)،و وتی: ئەی براوای خۆم، کارێکم بەسەردا هاتووە، نازانم چۆن لێی دەرچم، ئایا کەسێکی وەکو من رێی زیریم گرتووە، یان نا.؟ باسێکم بۆ بکە بەراستی ئەی برازای خۆم، حەزم لەوەیە قسەم بۆ بکەیت. پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) رووی پیرۆزی تێ کرد،و کۆمەڵە فەرمایشتێکی جوانی دا بە گوێدا، کە هیچ خەم و خەفەتێك لەدڵی ئیمامی حەمزەدا نەماو، دەست بەجێ فەرمووی: (أشهد أن لا الە الا الله، وأن محمد محمداً رسول الله) و موسڵمان بوو. دڵی لە ژەنگی بت پەرستی پاك كردەوە،و لاپەڕەی پاكی ژیانی دەست پێكرد، بەموسڵمان بوونی ئیمامی حەمزە هاوەڵان

(خوایان لیّ ڕازی بیّت)، زۆر دڵخۆش و پشت ئەستوور بوون، ئیمامی حەمزە دەستی کرد بەدەرس خوێندن لەمزانکۆی ئەرقەم لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ). خودا لیّت ڕازی بیّت ئەی گەورەی شەهیدان ... دوای موسڵمان بوونی ئیمامی حەمزە، هەر لەو ساڵەدا یەکێکی تر لە گەورە پیاوانی قوڕەیش موسڵمان دەبێت کە ئەویش (عومەری کوڕی خەتتاب) بوو خوا لیّی ڕازی بیّت، ڕۆژێک ئیمامی عومەر شمشێری هەڵکێشا ،و ڕۆشت بۆ کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ).! زانی لەماڵی ئەرقەمن، بیلالی حەبەشی (خوا لیّی ڕازی بیّت) لەکونی دەرگاکەوە سەیری کرد، فەرمووی: (عومەر کوڕی خەتتاب)هات خوای گەورە لەشەڕی بمان پارێزێت.! هاوەڵان شڵەژان، ئیمامی حەمزە فەرمووی: دەرگاکەی بۆ بکەرەوە ئەگەر بۆ خێر هاتبیّ باشە، ئەگینا

خۆم ڕووبەڕووی دەبمـــەوە، کاتێـــک دەرگاکـــەیان کـــردەوە، ئیمامی حەمزە لەپشتەوە هەردوو دەستی ئیمـامی عومـەری گرت، و پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) فـــەرمووی: وەرە عومـــەر، چونکە پێشتـــــــــــر پێغەمبەر (ﷺ) دوعای کردبوو، خـــوای گەورە ئیسلام سەربەرز بکات بە یەکێك لەم دووانە (عومەری کوڕی خەتتاب) و (عەمری کوڕی هیشام)[1] ئیمـامی عومـــەر ڕۆیشتە پێشـــەوە، پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) یەخـــەی ئیمـامی عومەری گرت، و ڕایوەشاند، فەرمووی: عومەر کـاتی ئـەوە نەهاتووە موسڵمان بیت..؟! ئیمامی عومەر فەرمووی: (أشـهد أن لا اله الا الله، وأنـك رسـول الله)، کـە ئیمـامی عومـەر

[1] ئەبوو جەهل ناوی (عەمری کوڕی هیشامە) پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر زۆر دژایەتی کردنی بۆ ئایینی ئیسلام ناوی نا ئەبوو جەهل، واتە (باوکی نەزانین).

موسڵمان بوو، هاوەڵان دەستیان کرد بە (الله اکبر) پاشان ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە لەسەر حەق نین.؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی ئەوان لەسەر ناحەق نین.؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی بۆچی بانگەوازی ئیسلام ئاشکرا نەکەین. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی عومەر تۆ فاروقی، حەق و باتڵ لەسەر دەستی تۆ جیا دەکرێتەوە.[٢] دوای ئەمە موسڵمانان بوون بە دوو ڕیز، ڕیزێکیان ئیمامی حەمزە لە پێشەوە بوو، ڕیزەکەی تریش

---

[٢] موسڵمان بوونی ئیمامی عومەر بە چەند قۆناغێك بوو، بۆ زیاتر شارەزا بوون سەیری ژیانی ئازیزمان بکە، بەرگی یەکەم، (موسڵمان بوونی عومەر).

ئیمامی عومەر، هاتن بەرەو کەعبە بە تەکبیـــر کـردن، کـافرە ملـهوڕەکانی قـورەیش،و دارو دەسـتەی شـەیتان ڕاوەستا بوون و هیچیان پێ نەدەکرا. بەرامبەر بە هـاوەڵان، چونکە هاوەڵان شیـرینی ئیمان لەدڵیاندا چەسپا بوو، وەك شاخەکان دامەزرابوون، لە بەرامبەر ئەو ئازارانـەی دەهاتـە ڕێگەیان. پێغەمبەری ئازیزیش (ﷺ) خەریکی بانگـەوازی خۆی بوو، تەنانـەت لـەپێناو گەیانـدنی ئـایینی پیـــرۆزی ئیسلام تووشی ئازارو ناخۆشی بوە، بێ ئـەدەبیان کـردووە بەرامبەری، یان هاوەڵان یەکێکی وەکو عەماری کوڕی یاسر (خوا لە خۆی و بـاوك و دایکـی ڕازی بێـت) لـەپێناو ئـەم دینەدا دایك و باوکی بەڕێزی لەدەست دان، بـامن و تـۆش بیـر بکەینەو بزانین چـیمان کـردووە بـۆ ئـەم دینـە. ئایـا وەفامان هەیە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، شتێکی زۆر

ئاسانت پیٰ بلێم کە زۆر وەفایەکی گەورەت هەبێت بەرامبەر بەپێغەمبەر (ﷺ) لەرۆژی قیامەتیشدا نزیك بیت لێیەوە (صەلاوات) دان لەدیداری پیرۆزی، بەرامبەر بە هاوەڵانیش شارەزا بوون لە ژیان وئاکاروڕەوشتە جوانەکانیان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەیان دەفەرمووێت: هاوەڵانی من وەك ئەستێرەن هەرکامیان بکەی بە پێشەنگ ڕێگە ون ناکەیت.! خوێنەرانی بەڕێزن خوشکان و برایان... زۆر پێویستمان بە شارەزا بوونی ژیانی پێغەمبەری ئازیزو (ﷺ) هاوەڵانی هەیە، بۆیە تکام وایە هەوڵبدەین خۆمان لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) شارەزا بکەین تا سەرفراز بین، وە ڕێگە ون نەکەین.

# جیهاد کردنی ئیمامی حەمزە

دوای ئەوەی موسڵمانان و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو مەدینەکۆچیان کرد، دەستووری مەدینە دانرا، موسڵمانان دەبێت ئاگادار بن، چونکە قورەیش دوژمنی موسڵمانان بوون، یەکێ لەوگرفتانەی پێویستی بە چارەسەرکردن بوو، لەلایەن سەرکردایەتی مەدینە، چونکە خەڵکی مەککە ڕازی نابن ئیسلام قەوارەیەکی هەبێ لە مەیدنە لەبەر ئەوە دەبێتە مەترسی خەڵکی مەککە هەوڵی زۆریان دا کە پێغەمبەر (ﷺ) نەگاتە مەککە، بۆ ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بڵاو نەبێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست پێشخەری خست دەبێت ئاگاداری دەوروبەری مەدینە بێت، بۆ ئەم

مەبەستە سریە[٢] بنێرێت، جا یەکێك لەو سریانەی کە ناردی سریە (سیف البحر) بوو،کە لە مانگی ڕەمەزانی یەکەمی ساڵی یەکەمی کۆچی دا بوو، بەرامبەر بە مانگی مارسی ساڵی (٦٢٣)ی زایینی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سی پیاوی لەموهاجیرین هەڵبژارد، بەشێوەی سریە ڕەوانەی کردن و (ئیمامی حەمزە)ی کردە ئەمیریان، ئالآیەکی سپی دایە دەستیان و فەرمانی دا بەسەریاندا تا ڕێ بە کاروانێکی قورەیش بگرن، چونکە هاوەڵان کاتێ کۆچیان کرد، هەموو شتێکیان بەجێ هێلآ، قورەیش داگیریان کرد، بۆیە مافی خۆیانە ڕێگە بە

[٢] سریە: بەو کۆمەڵە سەربازە دەوترێت کە پێغەمبەریان (ﷺ) لەگەڵ نەبووە.

کاروانیـان بگـرن، چـونکە لـەپێناو ئیسـلامدا سـەروەت و سامانیان هەموو بەجێ هێڵابـوو. بەڕاسـتی ئـەی هـاوەڵانی پێغەمبـەرمان(ﷺ) ، خۆمـان و دایـك و بـاوك و مـاڵ و ژیانمان بکەینە قوربانی خوڵی بـەر پێتـان، حـەقی ئێـوەی خۆشەویست نادەین بەڕاسـتی کەسـانێکی وەکـو ئێـوە لـە زانکۆی (ئەرقەمدا) دەرچـوون، لەبـەر دەسـتی پێغەمبـەری خودا (ﷺ) پەروەردە بوون، خوای میهرەبـان لێتـان ڕازی بێت، ئێمەی موسڵمان و شـوێن کەوتـەی پێغەمبـەر (ﷺ)، عاشقی ژیانی ئێوەین، عاشقی بینینی ڕوخساری جوانتانین، خزمەتکاری ژیانی ئێـوەین، خـوای گـەورە (جـل جلالـە) بەدیداری ئێوە شادمان بکـات. بـەڵێ ئـازیزان سـریەکەی ئیمامی حەمزە گەیشتن بە کاروانەکەی قـورەیش، کـە لـە شامەوە گەڕایەوە (٣٠٠) پیـاوی قـورەیش ئـەبوو جـەهلیان

لەگەڵ بوو، ئەوە بوو ئیمامی حەمزەو هاوەڵانی خوایـان لێ ڕازی بێت لە (عـیص)ـــەوە لـە قـەراغی دەریـاری سـووردا بەرامبەر بە یەك وەستان ڕیزیان بەست بۆ جەنگ، بەڵام لەم کاتەدا (مەجدی کوڕی عەمری جوهەینی) کـە هاوپـەیمانی هەردوولا بوو هات داوا لە هەردوو لاکرد، کە جەنگ نەکەن هەریەکەو گەڕانەوە جەنگ بەرپا نەبوو، ئەمە یەکـەم سـریە بوو پێشەوامان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەوانەی کرد.

## ئیمامی حەمزە لە جەنگی بەدردا

دوای ئەوەی خوای میهرەبان ڕێگەی دا بە جیهـاد کـردن، ئایەتی جیهـاد دابـەزی کـە دەفـەرمووێت: ﴿أُذِنَ لِلَّـذِينَ يُقَـاتَلُونَ بِـأَنَّهُمْ ظُلِمُـوا وَإِنَّ اللَّـهَ عَلَـى نَصْـرِهِمْ لَقَـدِيرٌ﴾ حەج ٣٩. واتە: جەنگ و جیهاد ڕێگەدار بۆ ئەو موسڵمانانەی شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ، لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ستەمیان لێ کراوە، وە بێگومان خوا بۆ سەرخستنیان بەتوانایە).

ئیبن عەبباس دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتێک بـوو لەڕێگەدان بە جیهاد، هاوەڵان زۆر دڵیان خۆش بوو بـەوەی کە خوای گـەورە و میهرەبـان (جـل جلالـە) ڕێگـەی دان بەجیهاد کردن، چونکە ئەوە سیانزە ساڵە ئەو بـێ باوەڕانـە ئازاریان دەدەن، وە ئێستاش ماڵیان داگیـــر کردوون.

(جەنگی بەدر) یەکەم ڕوبەڕووو بوونەوەی نێوان موسـڵمانان و کافرەکان بوو، کە جەنگ تیایا ڕوو بدات. خوای گـەورە ناوی ناوە (یوم الفرقان)، چونکە حـەق و باتـڵ تیایـا جیـا بوویەوە، هۆکارەکەشی قورەیش کاروانێکی بە هەزار وڵاخ و پەنجار هەزار دینار زێڕەوە لەو بازرگانییەدا ناردبوو، بۆ شـام ماڵی موسڵمانان بوو، سەر کاروانی ئەم بازرگانییـە (ئـەبوو سوفیان)، بوو کاروانەکە وەك وتمان ماڵی موسڵمانانی تیـا بـوو پێغەمبـەر (ﷺ)، لـەکاتی دەرچـوونی مەبەسـتی شەرکردن نەبوو، بەڵکو مەبەسـتی کاروانەکـەی قـوڕەیش بوو، لەم شەڕەدا ژمارەی موسڵمانان (٣١٣) کەس بوون.

بەڵام ژمارەی بێ باوەڕان (١٠٠٠) کەس بوون، بەڵام سوپای موسڵمانان خوایان لە پشت بوو، بەڵام سوپای کوفر شەیتانی ترسنۆك هاوڕازیان بـوو،((بۆیـە دەڵـێم شـەیتانی ترسـنۆك

چونکە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە دا ڕای کرد ووتی:﴿انی بریئ منکم انی اری مالا ترون انی اخاف الله والله شدیدالعقاب﴾ واتە:من لەئێوە بەریم ولێتان دووردەکەومەوە،چونکە من شتێک دەبینم ئێوە نایبینن،من لەالله دەترسم،چونکە بەڕاستی خوای گەورە(جل جلالە)زۆر تۆڵەسێن وتوندە))عمر زەڵمی.

دوای ئەوەی هەردوو سوپا بۆڕووبەڕووبوونەوەی جەنگ ڕیز بوون، لەو کاتەدا، پیاوێک لە سوپای کافرەکان هاتە دەرەوە بەناوی (ئەسوەدی کوڕی عەبدول ئەسەدی مەخزومی) وتی: پەیمان بێت، لە حەوزی موسڵمانەکان ئاو بخۆمەوە یان تێکی بدەم، یان سەر بنێمەوە. بەرەو حەوزی ئاوەکە هاتە پێشەوە، خێرا گەورەی شەهیدان شێری خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی حەمزە، خۆی گەیاندە لای ئەو

کافرە پیسە، بە یەك شمشێر نیوەی قاچــی قرتانــدو کەوتــە سەر زەوی بۆ ئەوەی سوێندەکەی بباتە سەر بە سکە خشــکە بەرەو حەوزەکە ڕۆی تا گەیشتە لای و شێری ئیسلام ئیمــامی حەمزە بە شمشێری دووەم بەرەو وجەهەنەم ڕەوانەی کــرد. هەر کە کافرەکان خوێنیان بینی، بە جارێ چــاویان پەڕیــە تەوقە سەریان، خۆیان ئامادە کرد بــۆ جــەنگ، بــەڵام بــەر لەوەی شەڕ دەست پــێ بکــات، یەکــەمجار بــە زۆرانبــازی دەستی پێکـــرد، ئەوە بوو عوتبەی کوڕی ڕەبیعە،و شــەیبەی برای وەلیدی کوڕی هاتنە دەرەوەو لەناو ســوپای کــوفر، وە لەناو سوپای موسڵمانان سێ گەنجی ئەنصاری بۆیان چوون، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لە خزمە نزیکەکانی خــۆی بەشــداری پێ کردن و فەرمووی: هەســتە عوبەیــدەی کــوڕی حــارس، حەمزە هەستە، هەستە عەلی، عوبەیدە چووە مەیدانی عوتبــە

ئیمامی حەمزە چووە مەیدانی شەیبە ئیمامی عەلی چووە مەیدانی وەلید، هەردوو سوپا چاویان بڕی بووە مەیدان و لەسەر خۆ هەناسەیان هەڵ دەمژی، چاوەڕووان بوون، ئەوە بوو ئیمامی حەمزەو ئیمامی عەلی بەرانبەری خۆیان بەرەو جەهەننەم ڕەوانە کرد، بەڵام عوبەیدەو عوتبە یەکتریان بریندار کرد،و ئیمامی حەمزەو عەلی خۆیان گەیاندە عوتبەو ئەویشیان ڕەوانەی جەهەننەم کرد. عوبەیدەیان هێنایەوە پاشان ئازارەکەی سەخت بوو، گیانی پاکی دەرچوو. پاشان تێزژان ڕوویدا، حەمزە شێری خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڕاست و چەپدا کافری دەکوشت، کەلێنی دەخستە ناو سوپای کافران خوای گەورە (جل جلالە) دوعای پێغەمبەری (ﷺ) قبوولّ کردو مەئیکەتی دابەزاند موسڵمانان بە فەزڵی خوا (جل جلالە) سەرکەوتنیان

بەدەست هێناو، سەرکردە گەورەکانی قورەیش وەکو ئـەبوو جەهل و ئومەییەو عوتبەو شەیبە هەمو ئەمانـە بـە سەرشـۆڕی سەریان نایەوە (٧٠) دیلیشیان لێ گیــران، دوای شـەڕەکە پێغەمبەر (ﷺ) بەناو دیلەکاندا دەگـەڕا، (عوقبـەی کـوڕی ئەبوو موعیتی) بینی، کاتێك پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمانی بـە کوشتنی دا، عوقبەی درۆزن وتی: ئەی کێ بـۆ منداڵـەکان ئەی موحەممەد (ﷺ).؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئاگر).! پاشـان پێغەمبـەر (ﷺ) ئـاوڕی دایـەوە بـۆ لای هاوەڵانی و فەرمووی: ئایا ئـەزانن ئەمـە چـی پێکـردم.؟! جارێکیان لە پشتی مەقامەوە لە سەجدەدا بووم، هات و پێی خستە سەر ملـم و شیلای و لای نـەبرد، هـەتا وام ئـەزانی هـەردوو چـاوم دەردەپـەڕن جـارێکی تـریش نـاو سـکی مەڕێکی هێناو خستیە سەر سەرم، منیش لە سەجدەدا بووم،

تا ئەوە بوو فاتمە هـات، و سـەرمی داشـۆری بۆیـە درا لـە گەردنی ئەو درۆزنە کە قوتابی شەیتان بـوو. بـەڵێ برایـان خوشکان ئەمە پێشەواکەمانە، با دەرس لـە ژیـانی خـۆی و هاوەڵانی وەربگرین. نەك لەو کەسانەی کە خۆیان بـژین و ژیانی خۆیان خۆش بێت، ئیـــر مێشـێك میوانیـان نیـە، ئەمانە کەسـانێکن لـە ئیسـلام تـێ نەگەیشـتوون، ئەگـەر تێشکەشتبن کاری پـێ ناکـەن، بـا خۆمـان لـەم کەسـانە بپارێزین. پێشەوای ئێمە موحەممەدە (ﷺ) نـەك کەسـانی تر. بەڵێ (جەنگی بەدر) کۆتایی پێ هات، بە سـەرکەوتنی موسڵمانان گەڕانـەوە بـەرو شـاری مەدینـەی پیـــرۆز، وە شێـــری ئیسلام ئیمـامی حـەمزە لـەم جەنگـەدا ڕۆڵێکـی ئێجگار بەرزی نیشان دا خوا لە ئەویش و سەرجەم هـاوەڵان

ڕازی بێـــــــــت، و ڕازیـــــــــش بـــــــــووە:
﴿...رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ...﴾ التوبة ١٠٠.

واتە: خوا ڕازی بوو لێیان وە ئەوانیش لە خـوا ڕازی بـوون.

جـەنگی ئوحـودو شـەهید بـوونی ئیمـامی حەمزەلـەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی بەدر، کە قورەیش تیایا تێك شکێنرا، وە سوپاکەیان بە غەمباری و گریانـەوە گەڕایـەوە مەککـە، پاشان (ئەبوو سـوفیان) و کـوڕانی سـەرکردەکانی وەکـو عیکرەمەی کوڕی ئەبوو جەهل، و صەفوانی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف ،داخ و خەفەتێکی زۆریان خوارد، بڕیاریانـدا تۆڵە بسێننەوە، یەکێکی تر لەو خەفەتبارانە (هیند)ی کچـی عوتبە بوو، کە بەدەستی گەورەی شەهیدان، ئیمامی حـەمزە باوکی و براکەی و مامی و هیندی هەرسێکیان لە جـەنگی بەدردا ڕەوانەی جەهەنـەم کردبـوون، بۆیـە زۆر ڕقـی لـە

موسڵمانان بوو، بەتایبەتی (ئیمامی حەمزە) بۆیە قورەیش خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگێکی گەورە لەگەڵ سوپای موسڵمانان ئەویش جەنگی (ئوحود) بوو، ئەم جەنگە لەرۆژی (شەممە پانزەهەم ڕۆژی مانگی شەوالی ساڵی سێهەمی کۆچی ڕووی دا)، وە هەروەها وەکو وتمان هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگە ئەوە بوو قورەیش ویستی تۆڵە لە موسڵمانان بکاتەوە بۆیە لەناو دوورگەی عەرەبی دا سەرشۆڕی بوو بۆ قورەیش کە سوپایەکی تازە بەناوی سوپای موسڵمانان سوپایەکی هەزار کەسیان تێك شکاندوە بەلام نازانن سوپای موسڵمانان (لااله الا الله) پشتیوانییەتی وە سوپای قورەیش شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خوا پشتیوانییەتی، بۆیە قورەیش بڕیاریاندا ئەو کاروانەی کە لەدەستی موسڵمانان ڕزگار بوو، پێش جەنگی بەدر سەرفی

بکـــەن بـــۆ جـــەنگی ئوحـــود، بۆیـــە قـــورەیش مـــاڵ و سامانەکانیان، بـۆ ڕێگـە گـرتن لـە بڵاوبوونـەوەی ئـاینی پیـــرۆزی ئیسـلام سـەرف دەکـەن، ئەوانـە تـەنها هەناسـە هەڵکێشانی پەشـیمانیان بـۆ ئەمێنێتـەوە، لـە ئەنجامیشـدا ئەدۆڕێن وەکو خوای میهرەبان لەقورئانی پیـــرۆزدا باسـی دەکات و دەفەرمووێت: ﴿الَّـذِينَ كَفَـرُوا يُنفِقُـونَ أَمْـوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ ئەنفال ٣٦.

واتە: بێگومان بێ باوەڕان ماڵ و سـامانی خۆیـان بـەخت دەکەن، بۆ ڕێگرتن لەڕێبازی خوا، جا بە تەئکیـد بـەردەوام بەختی دەکەن بۆ ئەو مەبەستە، پاشان دەبێتە مایەی ئێش و داخ بۆیـان و پەشـیمان دەبنـەوە،و سـامانەکەیان بـەخت دەکەن. بەڵام بۆ دوایی هەر ژێر دەکەون و تێك دەشـکێن،

دڵنیا بن گشت بێ باوەڕان بەرەو دۆزەخ دەبرێن و کۆ دەکرێنەوە. بەڵێ ئازیزان ئەوانەی دەیانەوێ بێ ڕێزی بەرامبەر بە ئیسلام یان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، ئەو کەسانە سەریان دای لە بەرد، هەمیشە سووك و ڕیسوان، وە ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر خۆشەویست دەبن لەدڵی خەڵکی دا. بەڵێ ئازیزان قورەیش بە (٣) هەزار کەسەوە بەرەو مەدینە دەرچوون، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەرێی ئیمامی عەبباسی مامییەوە، زانی بە وردی موسڵمانان ئاگادار دەکردەو کە قورەیش بەتەمایە بێتە سەر مەدینەو ژمارەیان ئەوەندەیە،و سواریان ئەوەندەیە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی کۆکردەوە،و پرس و ڕاوێژی پێ کردن، پێغەمبەر (ﷺ) ڕای خۆی ئەوە بوو لە مەدینەدا

بمێننەوە، بەڵام هاوەڵان هەندێکیان بەشداری جەنگی بەدری نەکردبوو، حەزیان لە چوونە دەرەوە دەکرد.

(عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی) سەرۆکی دوو ڕووەکان، لەگەڵ ڕاکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بوو، دوای ئەوەی پرس و ڕا کرا هاوەڵان زۆربەیان حەزیان لە چوونە دەرەوە کرد، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) چووە ژوورەوە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) وتیان بەقسەی پێغەمبەرمان بکردایە، جا وتیان بە پێغەمبەر (ﷺ) با نەچینە دەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ناگونجێ پێغەمبەرێك جل و بەرگی جەنگ بپۆشێ و دای بنێتەوە هەتا خوای گەورە بڕیارێك بۆ ئەو و دوژمنەکەی دەر ئەکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەودا دیبووی کەوا کەڵێك بووەتە شمشێرەکەی و گایەك سەربڕاوەو دەستی خستوتە ناو

قەڵغانێکی مەحکەمەوە. پێغەمبەر (ﷺ) هۆی کەلبوونی شمشێرەکەی بەکوشتنی پیاوێکی خزمی نزیکی لێک دابوویەوە، سەر برینی گاکە بە کوشتنی کۆمەڵێ لەیارەکانی، قەڵغانەکەشی بە مەدینە لێک دایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ڕای خۆی فەرز ناکات، بەڵکو پرس و ڕایش دەکات لەکاتی بەڕێکەوتنی سوپای ئیسلامدا، یەکەم کردەوەی مونافیقەکان دەستی پێکرد، (عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) گەڕایەوەو سێیەم کەسی لەگەڵ خۆی دا گەڕاندەوە، سوپای موسڵمانان (١٠٠٠) کەس بوون، بوونەوە بە حەوسەد کەس، وتی بەگوێی ئەوانی کرد،و لە مەدینەدا نەمایەوە، خەڵکینە لەم شوێنەدا بۆچی خۆمان بە کوشت بدەین ئیتر هەرچی ئیمان دانەمەزرابوو، وەکو خۆی گەڕانەوە، بەڵام ئەو حەوسەد

کەسەی مابوونەوە، ئەوانە بوون بەیعـەتی مـان و مردنیـان دابوو بە پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بـە حەوسەد کەسە ئیمانداره‌کەوە بەرێکەوت، پێغەمبـەر (ﷺ)، پەنجا هاوەڵی دانا لەسەر شاخەکە تەنها مەترسی لەو شـوێنە بوو، کە قورەیش مەجالی هاتنە ژوورەوەی هەبێت، پێغەمبـەر گیان (ﷺ) پێی فەرموون: لەدواوە بـەرگریمان لێ بکـەن ئەگەر دیتان وا ئێمە ئەکوژرێین مەیەن بە دەممانەوە، ئەگەر دیتـان ئێمـە دەسکەوت و غەنیمـەتمان دەسـت کـەوتووە بەشداریمان مەکەن، بەڵام چل لەو تیـر هاوێژانـە قسـەی پێغەمبەریان (ﷺ) شکاند، ئازیزان ئەم چـل کەسـە بـوون قسەی ئازیزان شکاند، ئەوە بوو لە جەنگی ئـەوەشمان لـە بیر نەچێت، کە (هیندی کچـی عوتبـە) کەسـێکی تایـەت کردبوو، بۆ کوشتنی ئیمامی حەمزە ئەویش (وەحشی کوڕی

حەرب) بوو، كۆيلەی (جوبەيری كوڕی موتعيم) بوو، هيندی وتی ئەگـەر حـەمزەم بـۆ بكوژيـت، لەكۆيلايـەتی ئـازادت دەكەم، وەحشی ڕم زانێكی زۆر زيـرەك بـوو، كـەم جـار هەڵەی بكردايە، لە هاويشـتنی دا بـەڵێ وەحشـی لەگـەڵ سوپای قوڕەيشدا كەوتە ڕێ بـۆ شـەڕ، بـەڵكو بـۆ كوشـتنی ئيمامی حەمزە، چونكە ئازادكردنی وەحشی بەسـتـرا بـوو بە كوشتنی ئيمامی حەمزەوە، پێش دەست پێكردنی جەنگ، هيند حەمزەی نيشانی وەحشی دا، حەمزە پەڕێكی كردبـوو بە سنگيدا، تا قـوڕەيش بـزانن حـەمزەی كـوڕی عەبـدول موتەليبە. بەڵێ شەر دەستی پێكـرد، لـە يەكـەم سـەعاتی شەڕەكەدا موسڵمانان سەركەوتنێكی باشيان بەدەست هێنـا، ئالا هەڵگری قوڕەيش بەنی عەبـدول دار بـوون، كـە يـەك خێزانی تەواو بوون بەدەستی شێری ئيسلام حەمزەو ئيمامی

عەلی و زوبێری کوڕی عەوام، هەموویان لەناو چوون، بـەڵام تیـــر هاوێژەکان، بینیان موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، وتیان با دابەزین قسـەکەی ئازیزیـان پشـت گـوێ خست. بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز، ئەم چل کەسە بەپێچـەوانەی قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ) جووڵانەوە، وە بوویە هـۆی شـەهید بوونی (٧٠) هـاوەڵ، ئـەی ئەگـەر لـەم سـەردەمەدا یـەك ئوممەت پشت گوێی ئـازیز (ﷺ) بکـات دەبێـت حاڵمـان چۆن بێت، حاڵمان ئاوایە کە دەیبینین، ئەو هەموو سـفووری و خۆ دەرخستنی ئافرەان و سـفووریان نـەك پشـت گـوێی ئازیزە، بەڵکو بێ فەرمانی ئایەتی خوای میهرەبانە.! بـەڵێ ئازیزان، تیر هاوێژەکان لە شاخەکە هاتنە خـوارەوە، تـەنها دە دانەیان نەبێت، بۆیە خالیدی کوڕی وەلید ویستی بەخۆی و ئەو کۆمەڵەوە کە درابوویە دەستی بکەڕێنەوە، بـەڵام کـە

زانی تیـــر هاوێژەکان زۆربەیان هاتنـە خـوارەوە، یەکسـەر لەپشتەوە هێرشیان هێنا بۆ موسڵمانان، دولـە هاوەڵاکاتیـان شەهید کرد، بەڵێ لەم کاتـەدا وەحشـی دەگـەڕا بـەدوای نێچیرەکەی خۆیدا، کە ئیمامی حەمزەیـە، سـەیر دەکـات وەك شێـــر لەناو سوپادا دەردەچێت، با بـزانین وەحشـی خۆی باسەکەمان بۆ تەواو بکات، چۆن شێـــری ئیسـلامی شـەهید کـرد: پیـاوێکی حەبەشـی بـووم، ڕمـم بەشـێوەی حەبەشییەکان دەوەشاند، زۆر کەم هەڵەم دەکـرد، لەگرتنـە نیشانەدا کاتێك خەڵکەکە بە یەك کەیشـتن چـووم سـەیری حەمزەم دەکـرد، تـا لـە نێـو خەڵکەکـەدا وەك حوشـتری کەڵەگەت بەدیم کرد، بە شمشێرەکەی خـەڵکی لـەت لـەت دەکرد،و هیچ شتێك لە بەردەمیدا خۆی نـەدەگرت، سـوێند بەخوا خۆمنم بۆ ئامادە دەکردو لە پشت درەختێکەوە خـۆم

شاردەوە تا بیپێکم، یان لێم نزیك بێتــەوە (سـیباعی کــوڕی عەبدول عوزا) بردمیە پێشــەوە، بــەرەو لای کاتێــك شـێری ئیســلام حــەمزە چــاوی پێــی کــەوت هــاواری لێ کــردو وتی:وەرە بەرەو ڕووم ئــەی کــوڕی خەتەنەکــەری کچــان. پاشان لێدانێکی وای لێ دا سەری لەلاشەکەی کردەوە، ئــا لەو کاتەدا ڕمەکەم جوولاند هەتا بە دڵــی خــۆم هاویشــتم، دای لە پشتی و لەنێوان قاچەکانییەوە هاتە دەر هەســتایەوە بەرو ڕووم هات، وەحشی دەڵێ لەترسی هەیبــەتی و ترســی چاوەکانی ئەبڵەق بووم نــەمتوانی بجــووڵێم ئازارەکــەی زۆر بوو کەوت. ئازیزان شەهید بوونی ئیمامی حەمزە لــە پێنــاو گەیاندنی ئیسلامدا بوو، دەبا ئێمــەش هەســت بــە هــەوڵ و ماندوو بوونی ئیمــامی حــەمزەو هــەموو هــاوەڵان بکــەین، چــونکە ئــەم دینــە بــە ئاســانی نەگەیشــتووەتە ئێمــە.

فەرمووی: کـەلبوونی شمشـێرەکەم بەکوشـتنی یـەکێك لـە خزمـە نزیکـەکانم لێـك دەدەمـەوە. وەڵاهـی ئـەی پێغەمبەر(ﷺ) گیان ئەی نووری چاوەکانم، ئـەی دکتـۆری دڵەکانمان بەڕاستی پێغەمبەری خوایـت، هـەر فەرمایشـتێك لەدەمی موبارەکت دەردەچێت لەلایەن پەروەردگارەوەیـە، چونکە خوای میهرەبان (جل جلالـە) خـۆی دەفـەرمووێت: ﴿وَمَـا يَنطِـقُ عَـنِ الْهَـوَى (٣) إِنْ هُـوَ إِلاَّ وَحْـيٌ يُـوحَى﴾ نەجم ٣-٤. بەڵێ وەحشی بەڕاکردن و بەدڵی خۆشەوە ڕای کرد،و بەرەو لای (هیند) چوو، کوشتم کوشتم بۆیە هیند هاتە سەر لاشەی ئیمامی حـەمزە،و سـکی هەڵـدڕی و جگـەری دەرهێنا،و خستییە دەمی و یەکێك لە کافرەکان هات دەمی ئیمـامی حـەمزەی بـە کلکـی شمشـێرەکەی کوتایـەوە ددانەکانی ورد کرد هیند ئەم شیعرەی وت:

نحن جزيناكم بيوم بدر *** والحرب بعد الحرب ذات سعر

ماكان عن عتبة لي من صبر *** ولا أخي وعمه وبكري

شخيت نفسي وقضيت نذري *** أزاح وحشي غليل صدري

واتە: ئێمە سزای ڕۆژی بەدرمان دانەوە، وە شەڕی دوای شەڕیش نارەحەتە لەدوای عوتبەو براکەم مامی کوڕەکەم ئارامم نەما، سارێژی دەروونی خۆم کردوو نەزرەکەم بەجێهێنا. پاش تەواو بوونی شەڕەکە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە هاوەڵان کرد فەرمووی: کێ شوێنی کوژرانی حەمزە شارەزایە، یەکێك لە هاوەڵان پێی نیشاندا، پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی موبارەکەی بردو چووە سەر لاشەی حەمزە،و بینی لاشەیان ئەتك کردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی کریاو هەناسەیەکی هەڵکێشا، ئینجا لە

ناوەڕاستی کوژراوەکاندا ڕاوەستاو فەرمووی: مـن شـایەتم لەسەر ئەمانە بەخوێنەکانیانەوە کفنیان بکەن، چـونکە هـەر برینێك لەپێناو خوا بێت، لەڕۆژی قیامەتدا خوێنی لێ دەتکـێ ڕەنگی خوێنەو بۆنی گولاوە.! هاوەڵی بەڕێز حەسانی کوڕی سابت دوای شەهید بوونی ئیمامی حـەمزە دەڵـێ: واز لـەو خانووە بهێنە کە درووست کردنی تەواو بووەو بـۆ حـەمزەی پایە بەرز بکری، ئەو پیـاوەی کـە خـۆی کـۆ دەکـردەوە،و سواری ئەسپەکەی دەبـوو، وەك شـێری بـە جـەرگ وابـوو لەبێشەکەیدا سپی بوو لە بنەچەدا و نەوەی هاشم بوو بەسـەر حەقدا نەدمڕۆیشت، بەناڕەوا لەنێو شمشـێرەکانتاندا شـەهید بوو، هەردوو دەستی وەحشی بکوژەکەی بشکێ.

بەڵێ سوپای مەککە بە دڵخۆشییەکی کاتییەوە، گەڕانەوە بۆ مەککە وەحشی ئازادکرا، وای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)

فەتحی مەککەی کرد، وەحشی ڕای کرد بۆ تائیف لەترسی ئەوەی نەکو بیکوژنەوە، یەکێك بوو لەو کەسانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێنی حەڵاڵ کردبوو، ڕێگەی بە کوشتنی دابوو، بەڵام ڕای کرد، پاشان تائیف نێردراویان هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وەحشی دەڵێ: پێیان وتم ئەو خراپە ناکات، لەگەڵ نێردراوەکاندا منیش لەگەڵیان دەرچووم، تاکو ڕۆیشتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتم: (أشهد أن لااله الا الله وأن محمد رسول الله) کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) منی بینی فەرمووی: تۆ وەحشیت، وتم بەڵێ.! فەرمووی: تۆ حەمزەت کوشت.؟! وتم: بەڵێ چۆنت پێ گەیشتووە هەروایە.!

فەرمووی: ئایا دەتوانی ڕووخسارتم لێ بشاریتەوە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو، پاش وەفاتی(موسەیلەمەی درۆزن) سەری هەڵدا، وتم دەبێت بچم بەکوشتنی ئەو کوشتنی حەمزە بسڕمەوە، بەڵێ وەحشی موسەیلەمەی درۆزنی کوشت، پاشان دەیوت بەم ڕمەم باشتـــرین کەسم کوشت، کە حەمزەیە، وە خراپ ترین کەسم کوشت کە موسەیلەمەی درۆزنە.

## فەرموودەیەك دەربارەی ئیمامی حەمزە

عن جابر علی قال: قال رسول الله (ﷺ) (سید الشهداء عند یوم القیامة حمزة بن عبدالمطلب). صحیح أنظر حیث رقم (٣٦٦٦) فی صحیح الجامع.

واتە: لەجابرەوە لە عەلییەوە دەڵێت: پێغەمبەر فەرموویەتی: سەردارو گەورەی شەهیدەکان لەڕۆژی قیامەتدا حەمزەی کوڕی عەبدول موتەلیبە.

عن أبی هوریره قال: قال رسو الله (ﷺ) (إن الله تعالی اطلع أهل بدر فقال: اعملوا ماشئتم فقد غضرت تکم) صحیح أنظر حیث رقم (١٧١٩) فی صحیح الجامع.

واتە: ئەبوو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

خـوای گـەورە سـەیری ئـەهلی بـەدری کـردو فـەرمووی هەرچیتان دەوێت بیکەن ئازە لێتان بووراوم.

ئازیزان دەبێت ئێمە ئـەوەش بـزانین کـە ئیمـامی حـەمزە یەکێکە لە دەسـتەی یەکـەمی ئیمانـداران، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ تەوبة ١٠٠.

واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشـتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش، خوا ڕازی بوو لێیان و ئـەوانیش لە خوا ڕازی بوون، بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ ساز داون، کە بە بەر درەخت و کۆشکەکانیاندا ڕووبا گەلێ

دەچێت، بە هەتا هەتایش تێـــدا دەمێننـــەوە، هـــەر ئـــەوەیش دەسکەوت و سەرفرازی گەورەو بەنرخە.

ئازیزان ئیمامی حەمزە یەکێکە لە ئەهلی بـــەدر خـــوا لێـــان خـــۆش بـــووە، وە گـــەورەی شەهیدانیشـــە وە یەکێکـــە لـــە (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُون) خوایە لەگەڵ ئەم کەسانەدا حەشرمان بکەیت، داواتان لێ دەکەم لەدوای خوێندنەوەی ژیانی ئەم کەڵە پیاوە دوعایەکی خێریش بۆ بەندەی گوناهبار بکەن.!

(وصلى الله علي نبينا محمد وعلى آله وسلم)

# سەرچاوەکان

قورئانی پیــرۆز

تەفسـیری ڕامـان ................. ئەحمــەد کاکــە مــەحمود

پوختەی تەفسیری قورئان....... موحەمەد مەلا ساڵح بـامۆکی

فـەرمووده قودسـیەکان ............ هـاوڕێ محمـد ئـەمین

البدایــة والنهایــة ..................... ابـــن کـــثیر

رجال والنساءحول الرسول ............. سـعد یوسـف ابـوعزیز

ژیانی ئازیزمـان ...................... حبیـب محمـد سـعید

ژیانامەی پێغەمبـەر(ﷺ)............... علـی محمـد الصلابی

ژیانی پێغەمبەری مـەزن(ﷺ) .......... عبـدالعزیز پـارەزانی

پـێ بـە پـێ خۆشەویسـت ................ عـەمر خالیـد

ئـەهلی بەهەشـت ............ یوسـف الحـاج محمـد

پیاوانێ لە دەوری پێغەمبەردا(ﷺ) ....... خالید محمد خالید

# پێڕســــــت